# (جەهەننەم)
# ئێستە باخێکی درەختە لە قودس!

سەروەر پێنجوێنی



(جەهەننەم) زاراوەیەکی ئێسکاتۆلۆجیا (أخرويات) ی یەهودی ـ مەسیحی ـ ئیسلامیە، بە تایبەتی لە قورئاندا کە زاراوەیەکی سەرەکیە. زاراوەکە لە قورئاندا پەیوەستە بە هەندێك زاراوە و چەمك و کەسێتیەوە کە لەگەڵ هەندێك هۆشیاری و زانیاریی مێژوییدا دۆزینەوەی رەگ‌وڕیشەی چەمکەکە ئاسان دەکەن. دەبێت ئەوەش بڵێین ئەم دۆزینەوەی رەگ‌وڕیشەیە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی خۆشبەختانە ئەو زاراوەیە لە دەقە یەهودی و مەسیحیەکانیشدا هاتوە و بە هۆی ئەمەشەوە توێژینەوەی چڕوپڕی لەسەر کراوە لەلای ئورۆپاییەکان، ئەگەرنا ئێمە دەبوا ساڵانێکی تریش چاوەڕێمان بکردایە ئەگەر تەنها لە دەقە ئیسلامیەکاندا بهاتایە. لێرەوە ئێمە رەخنەسازییەکی زمانی ـ مێژویی بۆ چەمکەکە دەخەینەڕو.

لـه قورئانـدا وشـەكە بـە شـێوەی (جەهەننـەم) هـاتوە، هـەروەكو لـە عەرەبیـدا وشـەكە بـە شـێوەی (جەهەننام) یش هەیە هەرچەند فەرهەنگە عەرەبیـەكان دەڵـێن ئەمـەیان بـە واتـای بـیری قوڵـە (بـەلاّم ئـەم واتایەش دور نیە لە شێوەی دۆزەخەوە لە ئەندێشەی مرۆڤدا). وشە قورئانیەكە راستەوخۆ (بـەپێی وتـەی گایگـەر وكەسـانی تـر) لـە وشـەی (گـەهیننام) גֵּהִנָּם ی ئارامیـەوە هـاتوە (لـە تـەلمودا) بـە هـەمان واتـا [هەندێك لە موفەسسیرە كۆنەكانیش ئەمەیان زانیوە، وەكو ئـەبو موسـلیمی ئیسفەهانیی موعتەزیلـەیی، كە وتویـەتی لـە "كـەهیننام" ەوە هـاتوە، بـەپێی وتـەی (الراغـب) لـە (*مفـردات ألفـاظ القـرآن*) دا و (ابـن منظور) لە (*لسان العرب*) دا. هەرچەند (ئارثـەر جێفـری) A. Jeffery پێـی وابـوە شـێوەی حەبەشـیی وشــەكە كــە بریتیــە لــە (گەهەننــەم) ገሀነም lgʌhʌnʌml (هەنــدێك جــاریش: گەهاننــەم ገሃነም lgʌhɑːnʌml) زیـاتر لـە شـێوە عەرەبیەكـەی قورئانـەوە نـزیكترە و زیـاتر دەشـوبهێت سەرچـاوەی راسـتەوخۆی بێـت، ئێسـتەش بـە گشـتی ئـەم رایـە پەسـەندە]. ئـەو وشـە ئارامیـەش دەگەڕێتەوە بـۆ وشـەی (گێهیننـۆم) גיהינום ی عیـبری كـە لـە بنەڕەتـدا دەستەواژەیەكە بـە شێـوەی (گیێ بین هیننـۆم) גֵּיא בֶן-הִנֹּם بە واتای (دۆڵی كوڕی هیننۆم) كە (هیننۆم) ئاماژەیـە بـۆ كەسێكی نەناسراو كە وا دەردەكەوێت خاوەنی ئەو دۆڵە بوبێت لە كۆنـدا، هەرچـەند هەنـدێك هـەوڵیان داوە بڵـێن ئاماژەیە بۆ پەرستراوێكی كـۆن. ئەمـە دۆڵـێك (نشـێوییەك) بـوە لـە شـاری ئورشـەلیم (القـدس)، بـەپێی بیروڕای زۆرینەش ئەو دۆڵەیە كە ئێستە پێی دەوترێـت (وادي الربابة) و دەكەوێتـە باشـوری خۆرئـاوای شاری قودس (شارە كۆنەكە). بێ گومان ئەم دۆڵە هەنـدێك تایبەتمەنـدیی هـەبوە كـە كردویانەتـە هێمای شـوێنی سـزادانی هەتاهـەتایی لـە ئـەدەبیاتی یـەهودی و ـ بەتایبـەتی ـ مەسـیحیدا و دواتـریش لـە دەقـە ئیسلامیەكاندا، بۆیـە دەبینـین لـە كتێبـی (*ئیرمیا*: ١٩: ٦، ٧) دا ئـەو دۆڵـە نـاونراوە (دۆڵی كوشـتار) גֵּיא הַהֲרֵגָה و پەیوەست بوە بە رۆژی دواییـەوە، دواتـریش لـە دەقـەكانی پـەیمانی نوێـدا وشـەكە (بـە شـێوەی گێهیننا Gehenna [گێیننا] γέεννα ـ ی یۆنانیزەكراو) (١٣) جار هاتوە وەكو ئاماژەیـەك بـۆ شـوێنی سزادانی هەتاهەتایی: (بڕوانە: *مەتتا*: ٥: ٢٢، ٢٩، ٣٠، ١٠: ٢٨، ١٨: ٩، ٣٣: ١٥، ٣٣. *ماركوس*: ٩: ٤٣، ٤٥، ٤٧. *لوكـا*: ١٢: ٥. *یـەعقوب*: ٣: ٦. *پێـترۆسی دوەم*: ٢: ٤). دواتـریش لـە قورئانـدا وشـەی (جەهەننەم) (٧٧) جار هاتوە بە هەمان واتا.

ئەم دۆڵە لە سەرەتادا لای کەنعانیەکان (یاخود عەموریەکان) تەرخان کرابو بۆ پەرستش و قوربانیی خواوەند (مۆلیك) یان (مۆلۆك) یاخود (مۆلۆخ) کە لە شێوی گایەکدا یان پیاوێکی بە سەر گا وێنە کراوە، و شێوەیەکی خواوەند (بەعل) ـە.





خواوەند مۆلۆخ

لە دەقە عیبریەکاندا ناوی بە شێوەی (مۆلیك) **מֹלֶךְ** یاخود (میلکۆم) **מִלְכֹּם** هاتوە، وشەکەش لە بنەڕەتدا بە واتای پاشا (ملك) ـە (= مێلێخ ـ ی کەنعانی ـ عیبری)، بەڵام بەپێی وتەی پسپۆڕان ئەم ناوە دەگەڕێتەوە بۆ نوسەری دەقە عیبریەکە و مەبەستیشی لەم ناونانە ئەوە بوە کە وشەکە بە هەندێك گۆڕانکاریی سەروبۆر دەبێتە وشەیەکی عیبریی تر بە واتای (شتێکی قێزەون)! کەواتە ئەم ناوە هەر خودی خواوەند بەعل یان جۆرە پەرستشێکی دەگرێتەوە. بەپێی بیروڕایەکی تریش، خواوەند (مولیك) خواوەندێکی تایبەتی و دیاریکراو بوە، چونکە ناوی خواوەندێك بە شێوەی (م ل ك) لە نەخشی دو نوشتەی دژەماردا بینراوەتەوە، جگە لەوەی ناوی خواوەندێك بەشێوەی (مالیك) یان (مالکو) دەخوێنرێتەوە کە لە دو دەقدا لەگەڵ خواوەند (نێرگال) ی بابلیدا بەرامبەر کراوە کە خواوەندی فەرمانڕەوای جیهانی ژێرزەوی (دۆزەخ) ـە.. ئەگەر وا بێت کەواتە ئەو خواوەندەی لە دۆڵی بینهینۆم قوربانیی بۆ کراوە لە راستیدا خواوەندی جیهانی مردوان بوە، رەنگە ناوەکەشی (مۆلیك ـ مالیك) بە واتای پاشا و فەرمانڕەوای ئەو جیهان بوبێت.

به هەر حاڵ، ئەو قوربانیانەی کە پێشکەشی ئەم خواوەندە یان ئەم جۆرە پەرستشە دەکرا قوربانیی مرۆیی بون، بە تایبەتی منداڵ، چاڵە ئاگرێکی قوڵ لەبەردەم پەیکەرەکەیدا دروست کرابو کە پەرستشکارەکان منداڵیان فڕێ دەدایە ناو ئەو چاڵە ئاگرەوە تا بەڵکو ئەو خواوەندە رازی بێت! (بێ گومان ئەم پەرستشە باکگراوند و مانا و پاساوی تەواوی خۆی هەیە لە بیرکردنەوەی ئەو پەرستشکارەکانەدا، کە لێرەدا بواری باسکردنی نیە)، لە چەند شوێنێکی تریش، وەکو کەرتهاجە، ئەم جۆرە پەرستش و قوربانیکردنە هەبوە، کە لەوێش فینیقیەکان ئەو قوربانیەیان بۆ کرۆنۆس Kronos کردوە (بەپێی گێڕانەوەی دیۆدۆری سیکیلیایی و پلوتارك). لە لوبنانیش (وڵاتی فینیقیەکان) شوێنەوارناسان گۆڕستانی قوربانیگەیەکی لەم جۆرەیان دۆزیوەتەوە کە لاشەی (٢٠٠٠٠) منداڵی سوتاوی تێدایە! هاوار!

ئیتر هەر لێرەوە ئەم دۆڵە پەیوەست بو بە دیمەنی ئاگر و سوتانی مرۆڤەوە. دواتر پاشای شانشینیی یەهودا (یۆشیا) Josiah (٦٤٨؟-٦٠٩ پ. ز.) پەرستگا و قوربانیگەکانی ئەم شوێنەی روخاند و بە شوێنێکی پیس و نەفرەتلێکراو و قەدەغەکراوی دانا بۆ ئەوەی کەس منداڵی خۆی تێدا نەکاتە قوربانی (بڕوانە: *پاشایانی دوەم*: ٢٣: ١٠)، ئیتر بوە شوێنێکی ترسناك و نەفرەتلێکراو. هەروەکو دواتریش هەمو پاشماوەی سوتاوی ئاژەڵی قوربانی و خاشاکی شار و جەستەی تاوانبارانی تێدا فڕێ دەدرا و دەسوتێنران. ئیتر هەمیشە دیمەنێکی ترسناکی هەبو و ئاگر و دوکەڵی لێ بەرز دەبوەوە و بۆنی ناخۆشی لێ دەهات و بێزراو بو. بەم شێوەیەش بوە هێمای شوێنی سزادان و سوتاندنی نەفرەتلێکراوان، هەمو دیمەن و ئاکارەکانی ئەو دۆڵەش لە وێنەسازیی دۆزەخدا رەنگیان داوەتەوە: قوڵی و تەنگی، دیمەنی ئاگر و دوکەڵ، دیمەنی سوتانی مرۆڤ، ئاکاری ترسناکی و نەفرەتی و بێزراوی. بۆیە ئەو دۆڵە هەم بە ناوەکەی ناوی (جەهەننەم) ی هێناوەتە گۆڕێ، هەم بە شێوە و دیمەنەکەی بیرۆکەی جەهەننەم و دیمەنەکانی پێك هێناوە.

وەکو وتمان، لە قورئانیشدا بە هەمان شێوە ئەو زاراوەیە بە شێوەیەکی سەرەکی بە کار هاتوە، بە واتای ئەوەی لە کوردیدا پێی دەوترێت (دۆزەخ)، بێ گومان لە هەمو کولتورێکدا زاراوەی تایبەتی هەیە بۆ هەڵگرتنی ئەو واتایە. لە قورئاندا وشەی تریش بە واتای دۆزەخ بەکارهاتوە، وەکو (جەحیم) (٢٥ جار) و (سەعیر) (١٦ جار) و (سەقەر) (٤ جار).. بەڵام وشەی (جەهەننەم) سەرەکیە و لە هەمویان زیاتر

بەکارهاتوە و زاراوەی بنەڕەتیە. ئینجا سیستەمی ئەو چەمك و کەسێتیانەی کە لەگەڵ ئەم زاراوەیەدا ئامادە دەبن لە قورئاندا قۆناغی بەرایی ئەم زاراوەیە بیر دەخاتەوە و ئاماژە بۆ مێژوی زوی زاراوەکە دەکات. ئەوەش کاتێك دەبینین فریشتەی خەزێنەدار و سەرۆکاری جەهەننەم بریتیە لە مالیك (مالك) (بڕوانە سورەتی: *الزخرف*: ٧٧)، کە هەمان خواوەند (مۆليك) ی کەنعانیی سەرۆکاری دۆڵی ناوزەد بە جێهیننۆمە، ئەمەش لە ڕێگەی ئەدەبیاتیی یەهودیی دواترەوە کە ئەو کەسێتیە بە (میری دۆزەخ) ناوبراوە.. دیارە (مۆلۆك) یاخود (مۆليك) ی عیبری بوەتە (ماليك) ی عەرەبی کە (فاعيل) داڕشتەیەکی عەرەبیە. بەم شێوەیە لە دەقە قورئانیەکەدا نەك تەنها وشەکە بەڵکو سیستەمی چەمك و کەسێتیەکانیش ئامادە بوەتەوە.

ئینجا ئێستە دۆڵی بینهیننۆم (یاخود جێهیننۆم کە بوەتە جەهەننەم)، کە ئێستە پێی دەوترێت (دۆڵی رەبابە)، نشێوییەکە لە شاری قودس کە هیچ دیمەنێکی ترسناك و نەفرەتیی نەماوە، بەڵکو باخێکی درەختە و کورتە گیایەکیش دایدەپۆشێت و شوێنێکی زۆر دڵگیرە و بۆ گەشتیار و رێبوارەکان دڵفرێنە! هەر کەسێکیش بیەوێت وێنەی ئەو باخی درەختە ببینێت تەنها لە سێرچی وێنەکانی Google دا بنوسێت ("وادي الربابة" یان "Wadi Al-Rababa") یاخود ("Valley of Hinnom" یان "Valley of Gehinom") و دوگمە لێ بدات چەندین وێنەی گەورە و جوانی ئەو دۆڵە سەوزەی دێتە بەردەم.



دۆڵی بینهیننۆم، دەوروبەری (١٩٠٠)

*ئێنسایکلۆپیدیای یەهودی*



دۆڵی بینهیننۆم، یاخود دۆڵی ڕەبابە، لە ئێستادا

کەواتە ئەوەی یەکەم جار پێی وتراوە (جەهەننەم) ئێستە باخێکی درەختە لە شاری قودس! ئەو سوتاندنی مرۆڤەش کە لە (جەهەننەم) دا کراوە دەستکاری مرۆڤەکان خۆیان بوە.

لێرەوە تێ دەگەین کە زۆر پێویستە سەرلەنوێ مێژوی چەمکە ئایینیەکان بنوسینەوە و بزانین چۆن گەشەیان کردوە و چۆن ئەم شێوەیەی ئێستایان وەرگرتوە..